

كورتەیەک دەربارەی کتێبەکە: ئیمامی الاجری كۆمەڵێک ئایەت و فەرموودەی هێناوە دەربارەی کرداری قەومی لوط ( نێربازی ) وە باسی پیسی و خراپی کردارەکەیان دەکات وە باسی حوکمی ئەو کەسانە دەکات کە ئەو کردارە دەکەن و هەر شتێک دەکەن کە لەو کردارەوە نزیک بێت ، الله تعالى پەنامان بدات

كورتەیەک لە ژیان نامەی ئەم ئیمامە بەرێزە :

ناوی محمدی كوری حسینی كوری عبداللهیە .

كونیەكەی : أبو بكر

ناسراوە بە : الآجری

ساڵی وەفاتی : ٣٦٠هـ

مامۆستاكانی :

١- ابراهيم بن موسى ، ابو اسحاق الجوزى التوزى ٣٠٣هـ

٢- احمد بن الحسين بن عبدالجبار ، ابو عبدالله الصوفى البغدادى ٣٠٦هـ

٣- جعفر بن محمد بن الحسين ، ابو بكر الفريابى ٣٠١هـ

٤- عبدالله بن العباس ، ابو محمد الطيالسى ٣٠٨هـ ( وە زۆرێكی دیكە )

قوتابیەكانی :

١- احمد بن عبدالله ، ابو نعيم الاصبهانى ٤٣٠هـ خاوەنى ( حلية الأولياء )

٢- على بن محمد بن عبدالله بن بشران ، ابو الحسن الاموى مولاهم البغدادى ٤١٥هـ

٣- ابو محمد عبدالرحمن بن عمر النحاس التجيبى المالكى البزار ٤١٦هـ ( وە زۆرێكى ديكە )

وە هەندێک لە بەرهەمەكانى :

كتاب ( الشريعة )

كتاب ( الغرباء )

كتاب ( اخلاق العلماء )

كتاب ( فرض طلب العلم )

كتاب ( قيام الليل والتهجد )

كتاب ( اداب النفوس )

كتاب ( تحرير النرد والشطرنج والملاهى )

كتاب ( ذم اللواط ) ئەمەى بەردەستت

كتاب ( الفتن )

كتاب ( التفرد والعزله )

كتاب ( حسن الخلق )

محمدى كوڕى حسين ( الآجري ) دەفەرمووێ:

١- سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە فەزڵی لەسەرمانە بە نیعمەتەکانی کە ناژمێردرێن، منەتی بەسەرمانەوەیە بەوەی کە ڕێنمونی کردوین بۆ دینی ئیسلام، وە کردوینی بە ئوممەتی پێغەمبەرەکەی محمد ( ﷺ )، وە فێری ئەو کتێبەی کردوین کە دایبەزاندووە ( قورئان )، وە زۆرێک لە سوننەتەکانی پێغەمبەرە نێردراوەکەی، وە فێری شەراعیئەکانی دینەکەمانی کردوین، وە حەڵاڵ و حەڕامی بۆمان ڕوونکردوەتەوە، وە حەق لە باتڵ جیاکردۆتەوە، هەروەها زەرەر لە قازانج، وە جوانی و چاکی لە خراپی و پیسی جیاکردۆتەوە، وە ئەوەی بۆمانە و ئەوەشی لەسەرمانە ( واتا ئەوەی بۆمان حەڵاڵە و ئەوەشی بۆمان حەڕامە )، وە نەیکردوین بە نەزانەکان کە هیچ شتێک نەزانین، سوپاس بۆ الله لەسەر ئەم شتانە، وە داوای زیاتر دەکەین لە فەزڵەکانی ، وە یارمەتیمان بدات لەوەی کە شوکری بکەین.

وەسەڵاواتی الله لەسەر مژدەبەخشەر و ئاگادارکەرەوە ( واتا ڕەسول الله )، وە چرای پرشنگدار، وە گەورەی بەنی ئادەم، ئەوە محمدی المصطفى یە ( هەڵبژێردراوە )، وە لەسەر ئەهلەکەی بە گشتی، وە لەسەر هاوەڵەکانی و لەوانەی کە هەڵبژێردراون، وە لەسەر خێزانەکانی کە دایکی ئیمانداارانن.

پاشان :

ئەی کۆمەڵەی ئیمانداران بزانن الله جل ذکره ڕازی بووە بەوەی کە ڕەوشتی جوان و شەرەفمەندانە بۆ ئێوە بێت، هەروەها پێی نیشان داون ( واتا ڕەوشتەکان )، وە پەیمانی پێداون بەوەی کە پاداشتتان بداتەوە لەسەری، هەروەها پێی ناخۆشە بەوەی کە ڕەوشتی نزم بۆ ئێوە بێت و قەدەغەی کردووە لێتان، وە حەڕامی کردووە لەسەرتان، وە پەیمانی پێداون بەوەی ئەگەر ئێوە بیکەن ئەوا سزایەکی گەورەتان دەدات، ئەوەشی ڕوون کردوەتەوە لە کتێبی

الله عزوجل و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ( ﷺ )، ئەوەی کە خوای بەخشندە بۆی ئاسان کردووم بەوەی کە باسی بکەم، هەروەها سنگیشمی فراوان کردووە بەوەی کە ئامۆژگارییەک لەمنەوە بۆ برایانی موسڵمانم لەم کتێبەدا.

ڕوونیبکەمەوە بۆ حەڕامبونی ڕەوشتێک لە ڕەوشتی نزم و فاحیشە کە دەبێتە هۆکاری زەلیلی و سوکی بۆ خاوەنەکەی، وە سزایەکی توند لە دونیادا و قیامەتدا لەسەریانە بەوەی کە حەڕامکراوە لەسەریان کە ئەنجامی بدەن ئەگەر بێتو تەوبە نەکەن، ئەوەش عەمەلی قەومی لوطە، ئەوەیە کە پیاو بچێتە لای پیاو ( واتا نێربازی ).

وە سەرگەورەی بەخشەرتان هەواڵی پێداون دەربارەی قەومی لوط وە پیسی ئەو کردارەی کە کردویانە لە نێربازی، وە لوط علیه السلام ڕێگری لێیان کرد، وە ئاگاداری کردنەوە بەوەی کە سزای الله عزوجل حەڵاڵ بوە بۆیان، وە کاتێک موخالەفەیان کرد، وە چێژیان بینی لەوەی کە الله عزوجل لەسەریان حەڕامی کردووە بەوەی کە نێر بڕواتە لای نێر، لەناوی بردن بە گەورەترین شێوازی لەناوبردن، وە سزای دان بە ترسناکترین شێوازەکانی سزا، لەوانەش: دای بەسەر چاویاندا و چاوی کوێر کردن، پاشان جبريل علیه السلام شارەکانیانی بە باڵەکانی هەڵکەند، بەرزی کردەوە تاکو ئاسمان و بەوەیشی کە لەناویایەتی، پاشان هەڵی گێڕایەوە بەسەریاندا، پاشان بەردباران کران بە بەردێک بە سجيل ( سجيل ئەهلی علم خیلافیان هەیە کە مانای چیە، هەندێکیان دەڵێن: مانای بەردێکە کە لایەکی قوڕە و لایەکی بەردە، وە هەندێکی تر دەڵێن: قوڕە بەڵام قوڕەکە سوتاوە تاکو وەکو بەرد ڕەق بووە)، هیچ کەسێک لێیان ڕزگاری نەبوو بە ئامادەبوو وە بە کۆچکردوش، ئیلا بەرد بەری کەوت تاکو کۆتا کەسیان لەناوچوو، وە دەوترێت ئەوان چوار سەت هەزار کەس بوون.

٢- الله تبارک وتعالی ئەمەی بۆتان باسکردووە ئەی کۆمەڵەی موسڵمانان دەربارەیان لە کتێبەکەیدا لە چەند سورەتێک لە قورئان، ئەگەر قورئان بکەیتەوە دەبینیت باسیان کراوە و باسی گەورەیی ئەو سزا کراوە کە توشیان بووە.

وە لەوەیش: لە سورەتی الأعراف، وە سورەتی هود علیه السلام، وە سورەتی الحجر، وە سورەتی الأنبیاء، وە سورەتی الشعراء، وە سورەتی نمل، وە سورەتی العنکبوت، وە سورەتی الصافات، وە سورەتی اقترب الساعة.

پاشان وتی ئەی ئوممەتی محمد ( ﷺ ) ئەی باشترین ئوممەت، ئاگاداری کردنەوە بەوەی کە ئێوە وەک ئەوان بن، لە سورەتی هود دەفەرمووێ: ( وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ ) ( ٨٢ ) ( مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ وَمَا هِيَ مِنَ الظَّالِمِينَ بِبَعِيدٍ ) ( ٨٣ ) ( هود )

( واتا : وە باراندمان بەسەریاندا لە سجیل بەدوای یەکدا و بێ پچڕان ) ( نیشانە کراوبوون لای پەروەردگارتەوە وە ئەو سزایە دوور نیە لە ستەمکارانەوە ).

٣- قتادە ( رحمه الله ) دەفەرمووێ: لە ستەمکارانی ئەم ئوممەتەیە.

وە الله عزوجل دەفەرمووێ لە سورەتی الحجر: ( لَعَمْرُكَ إِنَّهُمْ لَفِي سَكْرَتِهِمْ يَعْمَهُونَ ) ( ٧٢ ) ( فَأَخَذَتْهُمُ الصَّيْحَةُ مُشْرِقِينَ ) ( ٧٣ ) ( فَجَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ ) ( ٧٤ ) ( إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ ) ( ٧٥ ) ( وَإِنَّهَا لَبِسَبِيلٍ مُّقِيمٍ ) ( ٧٦ )

( واتا: سوێند بەتەمەنی تۆ ئەی محمد ( ﷺ ) بەڕاستی ئەوانە لەسەر خۆشی خۆیاندا سەرگەردانن ) ( جا لە کاتی خۆرهەڵهاتندا شریخەیەکی بەهێز گرتنی ) ( پاشان ئەو شارەمان سەرو ژێر کرد ) ( وە سجیلمان بەسەردا باراندن ) (

بەڕاستی لەمەدا بەڵگەی زۆر هەیە بۆ ئەوانەی کە بیردەکەنەوە ) ( وە بێگومان ئەو شارە وێران کراوە لەسەر ڕێگایەکی سەرەکی کاروانەکاندایە ).

وە لە سورەتی الأعراف لە چیرۆکی قەومی لوط دەفەرمووێ: ( وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُجْرِمِينَ )( ٨٤ )

( واتا : جا بارانێکمان بەسەردا باراندن بەرد بارانمان کردن جا سەیربکە سەرئەنجامی تاوان باران چۆن بوو ).

وە لە سورەتی العنكبوت دەفەرمووێ: ( وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الْفَاحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ الْعَالَمِينَ ( ٢٨ ) ( أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الرِّجَالَ وَتَقْطَعُونَ السَّبِيلَ وَتَأْتُونَ فِي نَادِيكُمُ الْمُنكَرَ ) ( ٢٩ )

( واتا : باسی لوطیش بکە کە بە گەلەکەی وت بێگومان ئێوە کارێکی ناشرین و قێزەون دەکەن ( نێربازی ) لە جیهاندا کەس پێش ئێوە ئەو کارەی نەکردووە ) ( ئێوە نێربازی دەکەن وە ڕێگا دەگرن لە ڕێبواران وە لە شوێنی کۆبونەوەکانتاندا هەموو خراپەیەک دەکەن ).

تا دەگاتە وتەی الله عزوجل: ( وَلَمَّا أَن جَاءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِيءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالُوا لا تَخَفْ وَلا تَحْزَنْ إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهْلَكَ إِلاَّ امْرَأَتَكَ كَانَتْ مِنَ الْغَابِرِينَ ) ( ٣١ ) ( إِنَّا مُنزِلُونَ عَلَى أَهْلِ هَذِهِ الْقَرْيَةِ رِجْزًا مِّنَ السَّمَاءِ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ ) ( ٣٤ ) ( وَلَقَد تَّرَكْنَا مِنْهَا آيَةً بَيِّنَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ) ( ٣٥ )

( واتا : وە کاتێ نێردراوەکانمان هاتن بۆلای لوط پێیان تێکچوو وە زۆر دڵتەنگ و ناڕەحەت بوو وتیان مەترسە خەم مەخۆ بێگومان ئێمە تۆ و خێزانەکەت ڕزگار دەکەین جگە لە ژنەکەت کە ئەو لە جێماوان دەبێت ) ( وە بەڕاستی ئێمە دەبارێنین بەسەر ئەم شارەدا سزایەک لە ئاسمانەوە لەبەر ئەوەی لە

سنوور و فەرمان دەرچوون ) ( سوێند بەخوا بێگومان لەم شارەدا نیشانە و پەندێکی دیارمان بەجێهێشت بۆ گەل و کۆمەڵێ کە ژیر بن ).

محمدی کوڕی الحسين ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

٤- لەم وتارو گوفتارانە تێ بگەن ئەی کۆمەڵەی موسڵمانان، بۆچی الله عزوجل بەسەرهاتی قەومی لوطی بۆ گێڕاونەتەوە، وە ئەو پیسی و خراپەکارییەی کە لەسەری بوون کە نێر ئەچووە لای نێر نەک ئەو مێیانەی بۆیان حەڵاڵ کرابوون کە زەواجیان لەگەڵ بکەن یان بچنە لای کەنیزەکەکانیان.

تێبفکرن لەم قەولەی الله عزوجل: ( كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ بِالنُّذُرِ ) ( ٣٣ ) ( إِنَّا أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ حَاصِبًا إِلاَّ آلَ لُوطٍ نَّجَّيْنَاهُم بِسَحَرٍ ) ( ٣٤ ) ( نِعْمَةً مِّنْ عِندِنَا كَذَلِكَ نَجْزِي مَن شَكَرَ ) ( ٣٥ ) ( وَلَقَدْ أَنذَرَهُم بَطْشَتَنَا فَتَمَارَوْا بِالنُّذُرِ ) ( القمر )

( واتا: قەومی لوط باوەڕیان نەهێنا بە پێغەمبەرەکەیان ) ( بەڕاستی ئێمەش ناردمانە سەریان بایەکی بەهێز بە وردە زیخەوە جگە لە کەسوکاری لوط کە لەبەرەبەیاندا ڕزگارمان کردن ) ( بە بەزەیی و ڕەحمەتی خۆمان هەر بەو شێوەیە پاداشتی سوپاسکاران دەدەینەوە ) ( وە بەڕاستی لوط قەومەکەی ترساند لە تۆڵەی سەختی ئێمە بەڵام ئەوان دەمەدەمێیان دەکرد لەو ترساندنانەدا و گومانیان هەبوو ).

تێبفکرن لە ئەمە ڕەحمەتی اللهتان لێبێت وە بیربکەنەوە بەوەی کە الله عزوجل ئاگاداری کردونەتەوە لەوەی کە وەکو ئەوان بن.

ئایا نەتان بیستووە الله جل ذكره فەرموویەتی: ( إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ ) ( الحجر : ٧٧ )

( واتا: بەڕاستی لەوەدا بەڵگەی گرنگ هەیە بۆ ئیمانداران )

تێبفكرن لەمە ئەی ئیمانداران، وە بزانن پەروەردگارتان ئاگاداری كردونەتەوە دەربارەی كردەوەی قەومی لوط، وە فێری كردوون دەربارەی ئەو سزایەی كە توشی قەومی لوط هات ببێت بە پەند بۆتان، ئاگاداربن ڕەحمەتی اللهتان لێبێت لە كردەوەی قەومی لوط.

ئایا نەتانبیستووە الله جل ذكرە هەواڵی پێداون دەربارەی ئەوانەی لە بەنی اسرائیل هەڵسان بە ئەنجامدانی ئەوەی كە الله حەرامی كردبوو لەسەریان لەوەی كە ڕاوبكەن لە ڕۆژی شەممەدا، وە كاتێک كردیان لەوەی كە نەهی كرابوو لەسەریان الله كردنی بە مەیمون، پاشان ئەفەرمووێ عزوجل: ( فَجَعَلْنَاهَا نَكَالاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ) ( البقره : ٦٦ )

( واتا : پاشان ئەم سزایەمان كردە پەند بۆ خەڵكانی ئەو سەردەمەو ئەوانەی دوای ئەوان وە ئامۆژگاری بۆ پارێزكاران ).

وە الله عزوجل دەفەرمووێ: ( وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ عَتَتْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِ فَحَاسَبْنَاهَا حِسَابًا شَدِيدًا وَعَذَّبْنَاهَا عَذَابًا نُّكْرًا ) ( ٨ ) ( فَذَاقَتْ وَبَالَ أَمْرِهَا وَكَانَ عَاقِبَةُ أَمْرِهَا خُسْرًا ) ( ٩ )( الطلاق )

( واتا : زۆر لە دێهاتی و شارییەكان سەرپێچیان كرد لە فەرمانی پەروەردگار و پێغەمبەرەكانی، ئێمەش پرسینەوەمان لەگەڵ كردن بە پرسینەوەیەكی سەخت وە سزامان دان بە سزایەكی دژوار ) ( ئیتر ئاكامی كردەوەی خۆیانیان چەشت وە سەرئەنجامی كاریان بوو بە سزای نالەبار و خەسارۆمەندی ).

پاشان دەفەرمووێ: ( فَاتَّقُوا اللَّهَ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ الَّذِينَ آمَنُوا قَدْ أَنزَلَ اللَّهُ إِلَيْكُمْ ذِكْرًا ) ( ١٠ ) ( رَّسُولا يَتْلُو عَلَيْكُمْ آيَاتِ اللَّهِ مُبَيِّنَاتٍ لِّيُخْرِجَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ ) ( ١١ ) ( الطلاق )

( واتا : لە الله بترسن ئەی خاوەنانی ژیری ئەوانەی باوەڕیان هێناو بێگومان الله قورئانی بۆ دابەزاندون ) ( پێغەمبەرێکی بۆ ناردوون کە دەیخوێنێتەوە بۆتان ئایەتەکانی الله کە ڕوونکەرەوەن تا دەربێنێ ئەوانەی کە باوڕیان هێناوە وە کردەوەی چاکیان کردوە لە تاریکستانی ( بێدینی ) بۆ ڕوناکی ( دینداری ).

محمدی کوڕی الحسین ( رحمه الله ) دەفەرمووێ:

لە الله بترسن ئەی کۆمەڵەی موسڵمانان، ئەی ئەهلی نوێژ، وە زەکات، وە ڕۆژوو، وە ئەی حاجیانی ماڵی الله، ئەی ئەوانەی کە الله واجبی کردوە لەسەریان کە ئەمر بە چاکە بکەن و نەهی لە خراپە بکەن ئاگاتان لە کرداری قەومی لوط بێت، وە ئەوە وەربگرن کە لەلای پەروەردگارەوە ئامۆژگاری کراون بەوەی کە بیکەن سەرفرازدەبن، وە داوێنتان بپارێزن تەنها لەلای خێزانەکانتان نەبێت یان کەنیزەکەکانتان.

ئایا وتەی الله جل ذکرەتان نەتانبیستووە کە دەفەرمووێ: ( قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ) ( ١ ) ( الَّذِينَ هُمْ فِي صَلاتِهِمْ خَاشِعُونَ ) ( ٢ )( وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ) ( ٣ )( وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ ) ( ٤ )( وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ ) ( ٥ )( المؤمنون )

( واتا :بەڕاستی باوەڕداران ڕزگاردەبن ( سەردەکەون ) ( ئەو کەسانەی لە کە نوێژەکانیاندا خاشیعن ) ( وە ئەوانەی لە شتی بێهودە خۆیان بەدوور دەگرن ) ( وە ئەوانەی کە زەکاتەکانیان دەردەکەن ) ( وە ئەوانەی کە پارێزەری داوێنیانن ).

وە الله عزوجل دەفەرمووێ: لە سورەتی (سأل سائل )، بەڕاستی خوای گەورە ئەخلاق و ڕەوشتی نوێژ خوێنانی وەسف کردووە ئەوانەی کە جێبەجێ ئەکەن و جیای کردونەتەوە لە ڕەوشتی ئەهلی فیسق و خراپەکاری، الله عزوجل

دەفەرمووێ: ( إِنَّ الإِنسَانَ خُلِقَ هَلُوعًا ) ( ١٩ ) ( إِذَا مَسَّهُ الشَّرُّ جَزُوعًا ) ( ٢٠ ) ( وَإِذَا مَسَّهُ الْخَيْرُ مَنُوعًا ) ( ٢١ ) ( إِلاَّ الْمُصَلِّينَ ) ( ٢٢ ) ( الَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلاتِهِمْ دَائِمُونَ ) ( المعارج )

( واتا : بێگومان ئادەمی دروست کراوە بە چاوچنۆکی و تەنگەتیلە ) ( کە ناخۆشیەکی توش بێ هاوار و ناڵە دەست پێدەکات ) ( کە سامانیش ڕوویتێبکات دەیگرێتەوە ) ( مەگەر نوێژکەران ) ( ئەوانەی کە بەردەوامن لەسەر نوێژەکانیان ).

پاشان باسی ئەو سیفەتانەی کردووە کە لەسەری بوون لە ڕەوشتە بەرزەکان، فەرموویەتی: ( وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ ) ( ٥ ) ( إِلاَّ عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ) ( ٦ ) ( فَمَنِ ابْتَغَى وَرَاء ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْعَادُونَ ) ( ٧ ) ( المؤمنون )

( واتا : وە ئەوانەی کە پارێزەری داوێنی خۆیانن ) ( مەگەر لە ژنانی خۆیان یان کەنیزەکێک کە بووبن بە خاوەنیان بێگومان ئەوانە لۆمەکراو نین ) ( ئینجا هەرکەسێک دوای شتێکی تر بکەوێت ئەو کەسانەن کە دەستدرێژکەرن ).

محمدی کوڕی الحسین ( رحمه الله ) دەفەرمووێ ؛

٥- لە الله بترسن ئەی کۆمەڵەی موسڵمانان، داوێنتان با لە سنوور دەرنەچێت بۆ ئەو شتانەی بۆتان حەڵاڵ نەکراون، وە بزانن سزای هەرکەسێک کە کردەوەی قەومی لوط دەکات ئەوا لەعنەتی الله عزوجل و ڕەسولەکەی لێبێت ( ﷺ )، لەگەڵ توندی سزاکەی لە دونیا و ئابڕوچوونی، وە ئەوەشی کە بۆی ئامادە کراوە لە دوارۆژدا لە تاوانی گەورە ئەگەر تەوبە نەکات.

٦- وە پێغەمبەر ( ﷺ ) دەفەرمووێ :

لەعنەتی الله لەو کەسەی کە کرداری قەومی لوط دەکات، لەعنەتی الله لەو کەسەی کە کرداری قەومی لوط دەکات، لەعنەتی الله لەو کەسەی کە کرادەری قەومی لوط دەکات. سێجار وای فەرموو، ڕیوایەت کراوە لە ابن عباسەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ).

٧- وە پێغەمبەر ( ﷺ ) دەفەرمووێ :

ئەگەر پیاوێک بڕواتە لای پیاوێکی دیکە ئەوا هەردووکیان زیناکارن.

٨- وە پێغەمبەر ( ﷺ ) دەفەرمووێ :

بکەر و بدەر بکوژن.

٩- وە پێغەمبەر ( ﷺ ) دەفەرمووێ :

ئەگەر بینیتان کەسێک کە کرداری قەومی لوط دەکات ئەوا بکەر و بدەر بکوژن.

١٠- وە ڕیوایەت کراوە لە ابو بکر الصدیقەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) کە پێی وترا و بۆی نوسرا کە پیاوێکیان دۆزیوەتەوە لە هەندێک لە شوێنەکانی عەرەب مارەدەکات هەروەکو چۆن ژن مارە دەکات ( واتا هاوسەرگیری لەگەڵ پیاو دەکات )، ابو بکر الصدیق ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) خەڵکانێکی لە هاوەڵانی ڕەسول الله ( ﷺ ) کۆکردەوە و ئاماژەی پێکردن کە حەدێکی ( واتا حوکمێکی شەرعی ) بۆ دابنێن، لەوانەش علی بن ابی طالب بوو ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ )، لەنێوانیاندا توندترین قسەی هەبوو لەو ڕۆژەدا، کە فەرمووی: ئا ئەمە هیچ ئوممەتێک لە ئوممەتەکانی تر کردەوەی پێ نەکردووە تەنها یەک ئوممەت نەبێت، وە

دەشزانن کە اللە چی پێکردن، من وای دەبینم کە بیسوتێنم بە ئاگر، وە سوتاندنی بە ئاگر

١١- وە عومەری کوڕی الخطاب ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) فەرموویەتی:

هەرکەسێک کرداری قەومی لوطی کرد بیکوژن.

١٢- وە کۆمەڵێ لە هاوەڵان و تابیعی کە ڕەحمەتی اللەیان لێبێت فەرموویانە:

نێرباز ڕەجم دەکرێت بە بەرد تاکو مردن، ژنی هەبێت یاخود نا، چونکە اللە عزوجل ڕەجمی قەومی لوطی کرد ئەوانەی کە ژنیان هەبوو وە ئەوانەشی کە ژنیان نەبوو.

١٣- وە لە ابن عباسەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) کە پرسیاری لێکرا دەربارەی نێرباز و حوکمەکەی؟ فەرمووی: سەیر دەکرێت ( واتا چ شوێنێک بەرزترینە لەو شارە ) و دەخرێتە سەر ئەو بەرزییە لە شارەکەو سەرەو خوار فڕێ دەدرێتە خوارەوە، پاشان بەردباران دەکرێت.

١٤- وە لە علی کوڕی ابی طالبەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ): ڕەجمی نێربازێکی کرد.

١٥- وە لە ابراهیمی النخعیەوە ( رحمە اللە ) فەرموویەتی:

ئەگەر بکرایە کەسێک دووجار ڕەجم بکرێت ئەوا نێرباز دووجار ڕەجم دەکرا.

١٦- وە لە الزهریەوە دەربارەی نێرباز: ڕەجم دەکرێت ژنی هەبێت یاخود ژنی نەبێت، سوننەتێکی پێشینەیە.

١٧- وە لە جابری کوڕی زەیدەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەربارەی پیاوێک کە داوێنی کردووە بە کۆمی پیاوێکدا، فەرمووی: کۆم ڕێز و حورمەتی گەورەترە لە داوێن، ڕەجم دەکرێت، ژنی هەبێت یاخود نا.

١٨- وە لە شەعبیەوە ( رحمە اللە ) فەرموویەتی:

دەکوژرێت، ژنی هەبێت یاخود نا

١٩- وە لە عطاء و ابن مسیبەوە فەرموویانە:

بکەر و بدەر بە زیناکار هەژمار دەکرێن، ڕەجم دەکرێن ژنیان هەبێت یاخود نا.

٢٠- وە لە عطاء بن ابی رباحەوە ( رحمە اللە ) دەفەرمووێ:

ئامادەبوم لای ابن زبیر ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) حەوت پیاویان بۆ هێنا کە نێربازیان کردبوو، چواریان خێزاندار بوون، وە سیانیان خێزاندار نەبوون، ئەو چوارەیان دەرکرد لە مزگەوتی حرام ڕەجم کران بە بەرد، وە ئەمر کرا بە سیانەکەی تر کە حەدیان بۆ بکرێت، وە ابن عمر و ابن عباس ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) لە مزگەوتەکە بوون.

محمدی کوڕی الحسین ( رحمە اللە ) دەفەرمووێ:

٢١- ئەمە وتەی مالکی کوری ئەنەسە، وە احمدی کوری حنبلە، مەبەستم لە نێربازە، ڕەجم دەکرێت ژنی هەبێت یاخود نا.

٢٢- وە شافعی و زۆرێک لە زانایان فەرموویانە:

خێزاندار ڕەجم دەکرێت ( واتا نێرباز )، وە ئەوەی خێزانی نیە جەڵد دەکرێت، وە دووردەخرێتەوە وەکو زیناکار ( واتا لە شار دوردەخرێتەوە ).

٢٣- ئەگەر یەکێک وتی:

ئەگەر یەکێک کردەوەی قەومی لوطی کرد، یان هاورێیەتی ئەو گەنجانەی کرد کە پەنجەیان بۆ ڕادەکێشرێت بە خراپەکاری، یان کەسێک کە کار بۆ

خراپەکاران دەکات وە مەی خواردەوە، وە هاوشێوەی ئا ئەوانە، ئا ئەوانە چۆن وەسف دەکرێن لەلای ئێمە؟

پێی دەوترێت:

هەرکەسێکت ناسی لە خەڵکیدا ئەمە سیفەتی بوو، وریابن تێکەڵی نەبن، وە لەگەڵی دامەنیشن، وە هاورێیەتیشی مەکەن، ئەگەر خزمایەتیت هەبوو لەگەڵی یان دراوسێت بوو، ئەوا ئامۆژگاری بکە و شارەزای بکە دەربارەی ئەو خراپەو پیسیەی کە لەسەریەتی.

ئەگەر لێی قبوڵ نەکردیت، ئەوا هەجری بکە، وە سەلامی لێ مەکە.

وە ئەگەر نەخۆش کەوت وە لەسەرت بوو بگەڕێیتەوە بۆلای ئەوا بگەڕێوە بۆلای، وە نەسیحەت و ئامۆژگاری بکە، وە فێری بکە ئەگەر تەوبە نەکەیت بۆلای الله عزوجل وە هەستای بە ئەنجامدانی ئەم خراپەکاریانە کە تۆ لەسەریت ئەوا ناگەڕێینەوە بۆلات لە کاتی نەخۆشیتدا، وە سەلامیشت لێ ناکەین، وە هەجریشت دەکەین، وە ئاگادارت دەکەینەوە، وە براکانیشمان ئاگادار دەکەینەوە لەتۆ، وە نەهی لە خەڵکی دەکەین هاوڕێیەتیت بکەن، بەڵکو تەوبە بکات ئەگەر ئامۆژگاری بکەن ان شاء الله.

ئەگەر یەکێک وتی:

باسی سوننەت و ئاثارەکان بکە کە پێشتر باس کراوە بۆیان لە وتە و ئەو هاوەڵانەی ڕەسول الله ( ﷺ )، وە وتەی ئەو هاوەڵانەی کە باست کردوون وە ئەوانەش لە تابعین کە بەدوایانەوە هاتوون، وە لە پێشەوایانی موسڵمانان، بۆمان باس بکە بە سەنەد بۆ ئەوەی بیکەین بە بەڵگە بۆ کەسێک کە نەزانە دەربارەی حەق، هانی بدە بە نەرمونیانی بە اللەی کەریم و بەخشندە، ئەو پشت دەبەستێت بە بەخششەکانی اللەی بەخشندە لەسەر تاوانەکانی، توشی

ئەو شتە دەبێت کە زەرەری پێ دەگەیەنێت لە دونیا و دوارۆژدا، وە تیادەچێت لە لەزەتیدا ( واتا لە لەزەتی تاوانەکەدا لەناودەچێت )، زیادەڕەوی لە نەفسی خۆی کردووە، بێشەرمە بەرامبەر پەروەردگاری عزوجل، توشی ڕق بۆتەوە لەلای الله عزوجل و لەلای فریشتەکان و لەلای کۆمەڵەی ئیمانداران.

پێی دەوترێت:
باسدەکەین لەوانە کە زانایان نەیان وتووە، بەڵام دەستپێدەکەین بە هەندێک لەوانەی کە پێمان گەشتووە دەربارەی قەومی لوط، وە لەوانەش کە توشی بوون لە سزا، وە کردنی بە عیبرەت بۆ ئەوانەی کە لە پاشیان دێن ئەگەر جگە لەمان کەسانێک هەڵنەستن بە ئەنجامدانی ئەم کردارە ( واتا بۆ ئەوانەی دوای ئەوان دێن ئەو کردارەی قەومی لوط نەکەن ).

٢٤- عمرو بن دینار ( رحمە الله ) لە وتەی الله عزوجل: ( إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الْفَاحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ الْعَالَمِينَ ) ( العنكبوت : ٢٨ )

( واتا : بێگومان ئێوە کارێکی ناشرین و قێزەون دەکەن لە جیهاندا کەس پێش ئێوە ئەو کارەی نەکردووە )

فەرمووی : هیچ نێرێک حەزو ئارەزوی نەچووبووە نێرێکی تر تاکو قەومی لوط هاتن.

٢٥- عباسی الدوری ( رحمە الله ) دەفەرمووێ :

پێم گەشتووە کە زەوی دەنگی بەرز دەبێتەوە کە پیاو لەسەر پیاو بێت.

٢٦- ابن شوذب ( رحمە الله ) دەفەرمووێ :

قەومی لوط چوار سەد هەزار کەس بوون.

٢٧- لە ابو عمرانەوە، فەرمووی: نازانم ئیلا لە عبداللّٰەی کوڕی ڕباحەوە نەبێت، لە کەعبەوە، فەرموویەتی:

ابراهیم علیه السلام سەرپەرشتی بەسەر سدوم دەکرد هەموو ڕۆژێک، دەی وت: وەیل بۆتۆ، ئەی سدوم، ڕۆژێک دێت بۆ تۆ نیە، وتی: ابراهیم فریشتەکان هاتن بۆلای، وە وتەی الله تعالی: ( وَلَقَدْ جَاءَتْ رُسُلُنَا إِبْرَاهِيمَ بِالْبُشْرَىٰ قَالُوا سَلَامًا ) ( هود : ٦٩ ) ( واتا: سوێند بەخوا بێگومان نێردراوەکانمان هاتن بۆلای ابراهیم بە مژدەوە وتیان سەلامی خوات لێبێت )، چیرۆکەکەی باسکرد، فەرمووی: ابراهیم دەربارەی قەمی لوط قسەی لەگەڵدا کردن، وتیان: ( يَا إِبْرَاهِيمُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَا ) ( هود : ٧٥ ) ( واتا :ئەی ابراهیم وازبهێنە لەم کارە ) فەرمووی: ( وَلَمَّا جَاءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِيءَ بِهِمْ ) ( هود : ٧٧ ) ( واتا: کاتێ کە هاتن فریشتەکانمان بۆلای لوط هاتنیان پێ ناخۆش بوو )، فەرمووی: بەڕاستی شوێنەکەیان خراپ بوو، تەنگیان پێ هەڵچنیبوو، فەرمووی: بردنیەوە بۆماڵی خۆیان، خێزانەکەی ئاشکرای کردن، قەومەکەی هاتن بۆلای بە هەناسەبرکێوە ، ( قَالَ يَا قَوْمِ هَٰؤُلَاءِ بَنَاتِي هُنَّ أَطْهَرُ لَكُمْ ) ( هود : ٨٧ ) ( واتا: وتی ئەی قەومەکەم ئەوانە کچەکانی منن ( مەبەستی کچەکانی هۆزەکە بوو ) ئەوانە پاک و حەڵاڵن بۆتان ) ئەوانە بخوازن ( أَلَيْسَ مِنكُمْ رَجُلٌ رَّشِيدٌ ) ( هود ٧٨ ) ( واتا : ئاخۆ پیاوێکی ژیر و تێگەشتوتان تێدا نیە ) تاکو وتەی الله: ( إِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا نُرِيدُ ) ( هود : ٧٩ ) ( واتا : بەڕاستی تۆ دەزانی ئێمە چیمان دەوێت ).

ابو عمران ( رحمه الله ) فەرمووی: لوط علیه السلام میوانەکانی لە ماڵی خۆیان دانابوو، وە لە تەنیشت دەرگای ماڵەکە دانیشتبوون دەی وت ( لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ آوِي إِلَىٰ رُكْنٍ شَدِيدٍ ) ( هود : ٨٠ ) ( واتا: وتی خۆزگە لەبەرامبەر ئێوەدا هێزێکم هەبوایە یان پەنایەکی قایم ببوایە )

فەرمووی: خۆی بدایەتە پاڵ عەشیرەتەکەی ( واتا عەشیرەتەکەی بیپاراستنایە ).

ابو عمران ( رحمە اللە ) دەفەرمووێ: پێم گەشتووە هیچ پێغەمبەرێک لە دوای قەومی لوط نەنێردراوە ئیلا لە شکۆداری هۆزەکەی بووە، فەرمووی: کاتێک فریشتەکان بینیان کە لوط علیە السلام توشی شتانێک بوە بەهۆی ئەمانەوە ( قَالُواْ يَا لُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُواْ إِلَيْكَ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ اللَّيْلِ وَلاَ يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ إِلاَّ امْرَأَتَكَ ) تاكو وتەی ( أَلَيْسَ الصُّبْحُ بِقَرِيبٍ ) ( هود : ٨١ ) ( واتا: فریشتەکان وتیان ئەی لوط بەڕاستی ئێمە نێردراوی پەروەردگاری تۆین هەرگیز ناگەنە لای تۆ جا شەوڕەوی بکە بە خێزان و کەسوکارت لە بەشێکی شەودا و با هیچ کەس لە ئێوە لانەکاتەوە بەدوای خۆیدا بێجگە لە ژنەکەت ) تاکو ( ئایا بەرەبەیان نزیک نیە).

جبریل علیە السلام بۆیان دەرچوو، بە باڵەکانی لە دەموچاوی دان و چاویانی طمس کرد، فەرمووی: مانای ( الطمس ) واتا چاو دەڕوات تاکو لەگەڵ دەموچاودا دەگەنە یەک ئاست ( واتا کوێری کردن و چاویان لەگەڵ دەموچاویان ساف بوون و یەک ئاست بوون ).

فەرمووی: جبریل شارەکەیانی بەرز کردەوە تاکو ئەهلی ئاسمان گوێیان لە وەڕینی سەگەکانیان بوو، وە دەنگی کەڵەشێرەکانیان، پاشان هەڵیگێڕایەوە بەسەریاندا، وە باراندی بەسەریاندا بەرد و تاوێری برژاو، وە فەرمووی: خەڵکەکە بەماڵەکانیشیانەوە، وە بە شوانەکانیشیانەوە، وە بە ڕێبوارەکانیشیانەوە، هیچ ئینسانێک دەربازی نەبوو.

٢٨- مجاهد ( رحمە اللە ) دەفەرمووێ:

جبريل عليه السلام دابەزی و باڵی خستە ژێر مەدائن ( شوێنی قەومی لوطە )، پاشان بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان تاکو ئەهلی ئاسمان گوێیان لە وەڕینی سەگەکان بوو، وە گوێیان لە دەنگی مریشک و کەڵەشێرەکان بوو، پاشان سەرەوژێری کردەوە، سەری کردە خوار و هەڵیگێڕایەوە، پاشان بەردباران کران.

٢٩- ابن عباس ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ:

لوط دەرگای لەسەر میوانەکانی داخست، وتی: هاتن و دەرگاکەیان شکاند، هاتنە ژوورەوە، جبريل دایەسەر چاویاندا و بیناییانی برد، وتیان: ئەی لوط، جادوگەرت بۆ هێناوین، وە هەڕەشەیان لێکرد، لەناخی خۆیدا توشی ترس بوو، وە فەرمووی: ئا ئەمانە ئەڕۆن ( واتا فریشتەکان )، وە ئازارم دەدەن، جبريل عليه السلام پێی فەرموو: مەترسە، ئێمە نێردراوی پەروەردگارتین، مەوعیدیان بەیانی زووە، لوط فەرمووی: کاتەکەی ( واتا ویستویەتی زووتر سزا بدرێن )، فەرمووی: ئایا بەیانی نزیک نیە؟ لوط فەرمووی: کاتەکەی، فەرمووی: بەرز کرایەوە، واتا شارەکە، تاکو ئەهلی ئاسمان گوێیان لە وەڕینی سەگەکان بوو، پاشان هەڵگێڕدرانەوە، وە بەر بەرد دران.

٣٠- حذيفه ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ :

کاتێک فریشتەکان نێردران بۆ قەومی لوط، بۆ ئەوەی لەناویان ببەن، پێیان وترا: قەومی لوط لەناو مەدەن، تاکو لوط سێجار شایەتی لەسەریان دەدات، وە لەسەر رێگای پێغەمبەر ابراهیم (عليه السلام) بوون، گەشتن بە ابراهیم (عليه السلام)، موژدەیان پێدا کە ویستیان پێی بدەن ( واتا مناڵی دەبێت ) ( فَلَمَّا ذَهَبَ عَنْ إِبْرَاهِيمَ الرَّوْعُ وَجَاءَتْهُ الْبُشْرَى يُجَادِلُنَا فِي قَوْمِ لُوطٍ ) ( هود : ٧٤ ) ( واتا : پاشان کە ترسی ابراهیم لاچوو نەما وە مژدەکەشی بۆهات لەبارەی قەومەکەی لوط دەمەتەقێی لەگەڵ دەکردین ) وە فەرمووی:

لەگەڵیاندا وتوێژی دەکرد و وتی : ئەگەر پەنجایان تێدا بێت ئایا لەناویان دەبەن ( واتا ئیماندار )؟ وتیان: نەخێر.

فەرمووی: ئەی ئەگەر چل کەس؟ وتیان نەخێر.

فەرمووی: ئەی سی کەس ؟ وتیان: نەخێر .

تاکو گەشتە دە یاخود پێنج ، سلیمان کە راوی ئەم ئەثەرەیە گومانی هەبوو ، گەشتن بە لوط ، لە زەویەک بوو ئیشی تێدا دەکرد، میوانداری کردن، قبوڵی کردن و گرتنیە خۆی تاکو شەو داهات، بردنی بۆلای ئەهلەکەی بۆ ئەوەی شەو لەگەڵیاندا بەسەر ببەن، ئاوڕی بۆیان دایەوە، وتی: ئەبینن ئەمانە چی دەکەن؟ وتیان: چی دەکەن، وتی: هیچ کەسێک نیە لەمان خراپتر بێت، تاکو گەشتن بە ماڵەکەی، ژنە پیرە خراپەکەی بۆی دەرچوو، قەومەکەی هێنا، ژنەکە بە قەومەکەی وت: لوط میوانداری قەومێکی کردووە، هەرگیز دەموچاوی وا جوانم نەدیوە، وە هەرگیز بۆنی وا خۆشم نەکردووە، بە هەناسەبرکێییەوە هاتن تاکو پاڵی دەرگاکەیان دا، خەریکبوو زاڵ دەبون بەسەر دەرگاکەدا، مەلائیکەیەک هەستا، دای لێیان و دەرگاکەی داخست، پاشان چونە سەربان، لوطیش لەگەڵیان چوە سەرەوە، پاشان لەگەڵیان وتووێژی دەکرد، ( قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطًا قَالُوا نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَن فِيهَا لَنُنَجِّيَنَّهُ وَأَهْلَهُ إِلاَّ امْرَأَتَهُ كَانَتْ مِنَ الْغَابِرِينَ ) ( العنكبوت ٣٢ ) ( واتا : ابراهیم وتی بێگومان لوط لەو شارەدایە وتیان ئێمە چاک دەزانین کێ لێیە سوێند بەخوا ئێمە لوط و ئەندامانی خێزانەکەی ڕزگار دەکەین جگە لە ژنەکەی کە لە جێماوان دەبێت ) ( يَا إِبْرَاهِيمُ أَعْرِضْ عَنْ هَذَا إِنَّهُ قَدْ جَاءَ أَمْرُ رَبِّكَ وَإِنَّهُمْ آتِيهِمْ عَذَابٌ غَيْرُ مَرْدُودٍ ) ( هود : ٧٦ ) ( واتا : ئەی ابراهیم وازبهێنە لەو کارە بەڕاستی بێگومان دەرچوە بۆ ئەو کارە فەرمانی پەروەردگارت وە بەڕاستی بۆ ئەوانە دێت سزایەکی نەگەڕاوە )، وتی: کاتێک زانی کە ئەوان نێردراوی اللهن، هیچ کەسێک

لە ئەوان ئەو شەوە نەما ئیلا كوێر بوو، ئەو شەوە توشی شەڕێك بوون، كە كوێر بوون و چاوەڕوانی سزایان دەكرد، لەگەڵ خێزانەكەیدا بوو، جبریل ڕوخسەتی لە لوط خواست بەوەی كە لەناویان بەرێت، جا روخسەتی دا، ئەو زەوییەی كە لەسەری بوون بەرز كرایەوە بۆ ئاسمان تاكو ئەهلی ئاسمان گوێی لە دەنگی سەگەكان بوو، وە لە ژێریشیان ئاگری كردەوە، پاشان سەرەوژێری كردەوە، فەرمووی: ئەو ژنەی كە لەگەڵیا بوو، گوێی لە دەنگی سەرەوژێركردنەوەكە بوو، سەیری دواوەی كرد، توشی سزاكە بوو.

٣١- ابن عباس ( رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ) لە وتەی الله ( وَلَمَّا جَاءَتْ رُسُلُنَا إِبْرَاهِيمَ بِالْبُشْرَى قَالُوا إِنَّا مُهْلِكُو أَهْلِ هَذِهِ الْقَرْيَةِ إِنَّ أَهْلَهَا كَانُوا ظَالِمِينَ ) ( ٣١ ) ( قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطًا قَالُوا نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَن فِيهَا ) ( ٣٢ ) ( العنكبوت ) ( واتا : وە كاتێك نێردراوەكانی ئێمە موژدەی بەخشینی اسماعیلیان دا بە ابراهیم وتیان بێگومان لەناوبەری دانیشتوانی ئەم شارەین بەڕاستی دانیشتوانەكەی ستەمكار بوون ) ( ابراهیم وتی بێگومان لوط لەوشارەدایە وتیان ئێمە چاك دەزانین كێ لێیە).

فەرمووی: ابراهیم وتووێژی لەگەڵ فریشتەكان كرد دەربارەی قەومی لوط، كە وازیان لێ بهێنرێت، وتی : ئەبینن ئەگەر دە ڕیز لە موسڵمانان تێدابێت ئایا وازیان لێدەهێنن؟ فریشتەكان وتیان: لەنێویاندا نە دە هەیە و نە پێنج هەیە، نە چوار، نە سێ، نە دو هەیە ( واتا دو ڕیزی موسڵمانیشیان تێدا نیە )، وتی: ابراهیم علیه السلام بەزەیی بە لوط و خاوخێزانەكەی هاتەوە ( قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطًا قَالُوا نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَن فِيهَا لَنُنَجِّيَنَّهُ وَأَهْلَهُ إِلاَّ امْرَأَتَهُ كَانَتْ مِنَ الْغَابِرِينَ ) ( ٣٢ ) ( ابراهیم وتی بێگومان لوط لەوشارەدایە وتیان ئێمە چاك دەزانین كێی لێیە سوێن بەخوا ئێمە لوط و ئەندامەكانی خێزانەكەی ڕزگار دەكەین جگە

لە ژنەکەی کە لە جێماوان دەبێت ) هەروەها ( يَا إِبْرَاهِيمُ أَعْرِضْ عَنْ هَذَا إِنَّهُ قَدْ جَاءَ أَمْرُ رَبِّكَ وَإِنَّهُمْ آتِيهِمْ عَذَابٌ غَيْرُ مَرْدُودٍ ) ( ( هود : ٧٦ ) ( ئەی ابراهيم وازبهێنە لەو کارە بەڕاستی بێگومان دەرچووە بۆ ئەو کارە فەرمانی پەروەردگارت وە بەڕاستی بۆ ئەوانە دێت سزايەکی نەگەڕاوە ) ، الله جبريلی بۆيان نارد و لەناوی بردن بە يەکێک لە باڵەکانی، سەرەو ژێری کردەوە وە بەدواياندا بەردباران کران لە هەموو جێگايەک لە زەوی.

محمدی کوڕی الحسين ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

٣٢- ئەو کەسەی ڕێکخەری ئەمە بوو ( واتا الله ) زانی کە قەومی لوط هەموويان لەناوچوون بەهۆی قێزەونی کارەکەيانەوە ئەوەی لە ناوياندا خێزاندار بوو ياخود خێزاندار نەبوو، وە ئەوانەش لە ژنان کە ڕازی بوون بە کردەوەکانيان، تاکو ژنەکەی لوط بەهۆی خراپەکاريیەوە لەناوچوو، الله عزوجل لەناوی برد لەبەر ئەوەی ڕێگەی بە قەومی لوط نيشاندا بەوەی کە لوط چەند ميوانێکی هەيە بۆ ئەوەی خراپەکاری لەگەڵياندا بکەن، الله عزوجل لەناوی برد لەگەليان

- ابن عباس لە وتەی الله ( فَخَانَتَاهُمَا ) ( التحريم : ١٠ ) ( واتا : خيانەتيان لەگەڵ کردن )

فەرمووی : ئەوەبوو کە هەردوکيان ( واتا ژنەکەی لوط و ژنەکەی نوح ) لەسەر دينی پياوەکانيان نەبوون، ژنەکەی نوح نهێنيەکانی نوحی ئاشکرا دەکرد بەوەی هەرکەس لە قەومی نوح ئيمانی بهێنايە ئەوا سەرگەورەکانی لە قەومی نوح ئاگاداردەکردەوە ئا ئەوەش کردەوەکەی بوو.

پاشان ژنەکەی لوط ئەوەبوو ئەگەر لوط عليه السلام ميوانداری کەسێکی بکردايە ئەوا ئەوانەی لە خەڵکی شارەکە ئاگاداردەکردەوە کە خراپەکاربوون (

فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ اللَّهِ شَيْئًا ) ( التحريم : ١٠ ) ( واتا : کەچی مێردەکانیان نەیانتوانی شتێک لە سزای خوایان لێ دوربخەنەوە).

٣٤- وهب بن منبه ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

کاتێک فریشتەکان چونە لای لوط، لوط وا گومانی برد کە ئەوان میوانن و میوانداری کردن لەگەڵیان، وە دڵخۆشبوو پێیان، وە کۆبوەوە لەگەڵیان، وە پێداگری دەکرد کە گەورەییان پارێزراو بێت، وە ژنەکەی پێچەوانەی کرد و چوو بۆلای خراپەکارانی قەومەکەی، هەواڵی پێدان بەوەی لوط جوانترین دەموچاوانێکی لە خەڵکی میوانداری کردوە، وە جوانترینن، وە خۆشترین بۆنیان هەیە، ئائەمەیش ئەو خیانەتەی ئەوە کە الله عزوجل لە قورئاندا باسی کردووە.

٣٥- سليمان بن قتە ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

گوێم لە ابن عباس ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) بوو باسی خیانەتی ژنەکەی نوح و ژنەکەی لوط کرا، فەرمووی: واللّٰهی زینایان نەکردووە، وە هیچ ژنێکی پێغەمبەرێک هەرگیز زینای نەکردووە، پێی وترا: خیانەتی ژنەکەی نوح و ژنەکەی لوط چی بوو؟ فەرمووی: ژنەکەی نوح هەواڵی دەدا کە نوح شێتە.

وە ژنەکەی لوط : رێگەی بە خەڵکی نیشان دەدا لە میوانەکان.

# باب ( ١ )

ئەو سوننەت و ئاثارانەی کە کردەوەی قەومی لوطی لەسەر ئەم ئومەتە حەڕام کردووە کە پیاو برواتە لای پیاو .

٣٦- جابری کوڕی عبداللە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ( ﷺ ) فەرمووی:

ئەوەی کە من زۆر لێی دەترسم لەبارەی ئوممەتەکەمەوە بڵاوبونەوەی کرداری قەومی لوطە ( واتا نێربازی )

٣٨- ابن عباس ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی :

لەعنەتی اللە لەو کەسەی دەڕواتە لای ئاژەڵێک، وە لەعنەتی اللە لەو کەسەی کە کرداری قەومی لوط دەکات.

٣٩- لە ابن عباسەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ( ﷺ ) فەرمووی:

لەعنەتی اللە لەوەی کە جگە لە سەرگەورەکانی خۆی کەسێکی تر بە گەورەی خۆی بزانێت ( واتا : کۆیلەیەک کە ئازاد کراوە و کوفرانەی باشی خاوەنەکەی ئەکات کە ئازادی کردووە، یان خۆی لێ بەریئ ئەکات، یان بەکەسێکی تر بڵێ تۆگەورەی منی و یەکێکی تر بەخاوەنی خۆی بزانێ ) ، وە لەعنەتی اللە لەو کەسەی کە سنورەکانی زەوی دەگۆڕێت ( واتا زەوی داگیر دەکات ) وە لەعنەتی

الله لەو کەسەی کە کردەوەی قەومی لوط دەکات، وە لەعنەتی الله لەو کەسەی کە کردوەی قەومی لوط دەکات، وە لەعنەتی الله لەو کەسەی کە کردەوەی قەومی لوط دەکات، سێجار، وە لەعنەتی الله لەو کەسەی کە بۆ غەیری الله سەردەبڕێت، وە لەعنەتی الله لەو کەسەی کە دەڕواتە لای ئاژەڵێک.

# باب ( ٢ )

ئەوەی کە ڕیوایەت کراوە دەربارەی ئەوەی کە پیاو دەستگەمە لەگەڵ پیاودا بکات  هەردووکیان زیناکارن و نەهی کردن لەوەی کە پیاو بڕواتە لای پیاو

٤٠- لە ابو موسی الأشعریەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی :

ئەگەر پیاوێک چوە لای پیاوێکی تر ئەوا هەردووکیان زیناکارن.

٤١- لە ابو موسی الأشعریەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی :

ئەگەر پیاوێک چووە لای پیاوێکی تر ئەوا هەردووکیان زیناکارن.

٤٢- لە ابی سعیدەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی :

پیاو سەیری داوێنی پیاو ناکات، وە هیچ پیاوێک لەگەڵ پیاوێکی تر لە جلێکدا کۆنابنەوە ( واتا نابێت ڕووت بن و هیچ شتێک لە نێوانیاندا نەبێت ).

٤٣- سمرە بن جندب ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ :

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) نەهی کردووە لەوەی کە پیاو لەشانی پیاو ڕابکشێت، ئیلا لەنێوانیاندا جلێک هەبێت.

٤٤- ابن عباس ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ :

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) نەهی کردووە لەوەی کە پیاو دەستگەمە لەگەڵ پیاو بکات، وە ژن لەگەڵ ژن.

٤٥- لە ابی هریرەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی : ژن دەستگەمە لەگەڵ ژن ناکات، وە پیاویش لەگەڵ پیاودا.

محمدی کوڕی الحسین ( رحمە اللە ) دەفەرمووێ :

ئەگەر پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) نەهی کردبێت لەوەی کە پیاو دەستگەمە لەگەڵ پیاو بکات وە نەهی کردبێت لەوەی کە پیاو سەیری داوێنی پیاو بکات، جا گومانتان چۆن دەبێت دەربارەی ئەو کەسەی کە کردەوەی قەومی لوط دەکات.

محمدی کوڕی الحسین ( رحمە اللە ) دەفەرمووێ :

وە ڕیوات کراوە لە پێغەمبەرەوە ( ﷺ ) لەوەی کە ئافرەت بڕواتە لای ئافرەت، یان هەندێکیان سیحاق بکەن لەگەڵ هەندێکی دیکەیاندا ( سیحاق واتا ئافرەت داوێنی لە ئافرەتێکی تر بخشێنێت و چێژ ببینن لەو جۆرە کارانە یان هەر شتێکی لەو شێوەیە ) بە زینا حساب دەکرێت لەنێوانیاندا، وە عەلی کوڕی ابی طالب ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) جەڵدی کردون بە سەد جەڵد سەد جەڵد.

٤٦-لە واثلەی کوڕی الاسقعەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

سیحاق کردنی ئافرەت لەگەڵ یەک ئەوا زینایە لەنێوانیاندا.

٤٧- لە واثلەی کوری الاسقعەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) ، وە ئەنەسی کوری مالکەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

دونیا ناروات ( واتا تەواو نابێت ) تاکو ئەو کاتەی پیاو پێویستی بە پیاو دەبێت ( یان بەسدەبێت بۆی ) ، وە ژنیش بۆ ژن بەسدەبێت ، وو سیحاق کردنی ئافرەتان لەگەڵ یەک ئەوا بە زینای ئافرەتان حساب دەکرێت لە نێوانیاندا .

٤٨- لە جەعفەری کوڕی محمدەوە ، لە باوکیەوە، لە عەلیەوە (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) دەفەرمووێ:

دوو سیحاقیان بۆ على بن ابى طالب ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) هێنا ئەویش جەڵدی کردن بە سەد دانە سەد دانە.

# باب ( ٣ )

باسی سزای نێرباز ئەوەش کوشتنی بکەر و بدەرە

٤٩- لە ابن عباسەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

بکەر و بدەر بکوژن .

٥٠- لە ابن عباسەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

ئەگەر بینیتان کەسێک کە کرداری قەومی لوط دەکات ئەوا بکەر و بدەر بکوژن .

٥١- لە ابن عباسەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

ئەگەر بینیتان کەسێک کە کرداری قەومی لوط دەکات ئەوا بکەر و بدەر بکوژن .

٥٢- لە ابی هریرەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

ئەگەر بینیتان کەسێک کرداری قەومی لوط دەکات ڕەجمی بکەن، یان وتی: بیکوژن، بکەر و بدەر.

٥٣- محمدی کوڕی منکدر ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

خالدی کوڕی ولید ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) نوسی بۆ ابو بكر الصديق( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) كە پیاوێكیان دۆزیوەتەوە لە هەندێک لە شوێنەكانی عەرەب مارەدەكات هەروەكو چۆن ژن مارە دەكات ( واتا هاوسەرگیری لەگەڵ پیاو دەكات ) ، ابو بكر الصديق ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) خەڵكانێكی لە هاوەڵانی رەسول الله ( ﷺ ) كۆكردەوە و ئاماژەی پێكردن كە حەدێكی ( واتا حوكمێكی شەرعی ) بۆ دابنێن، لەوانەش علی بن ابی طالب بوو ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ )، لەنێوانیاندا توندترین قسەی هەبوو لەو رۆژەدا، كە فەرمووی: ئا ئەمە هیچ ئوممەتێک لە ئوممەتەكانی تر كردەوەی پێ نەكردووە تەنها یەک ئوممەت نەبێت، وە دەشزانن كە الله چی پێكردن، من وای دەبینم كە بیسوتێنم بە ئاگر، وە سوتاندنی بە ئاگر.

فەرمووی: ابو بكر ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) بۆیانی نوسی كە دەبێت بە ئاگر بسوتێندرێن.

فەرمووی: پاشان سوتاندیانی، وە ابن زبیر ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) سوتاندیانی، وە هشامی كوری عبدالملک ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) سوتاندیانی.

٥٤- ابي نضرة ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

لە ابن عباسەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) كە پرسیاری لێكرا دەربارەی نێرباز و حوكمەكەی؟ فەرمووی: سەیر دەكرێت ( واتا چ شوێنێک بەرزترینە لەو شارە ) و دەخرێتە سەر ئەو بەرزیە لە شارەكەو سەرەو خوار فرێ دەدرێتە خوارەوە، پاشان بەردباران دەكرێت.

٥٥- لە ابی هریرەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

ئەگەر بینیتان کەسێک کە کرداری قەومی لوط دەکات ڕەجمی بکەن، یان وتی: بەرز و نزم بکوژن (واتا بکەر و بدەر).

# باب ( ٤ )

باسی ئەو کەسەی کە وتی : حەدی نێرباز ڕەجم کردنە

٥٦- عن شيخ من همدان : لە عەلی کوڕی ابی طالبەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) نێربازێکی ڕەجم کرد.

٥٧- لە يزيد بن قيسەوە ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

لە عەلی کوری ابی طالبەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) ڕەجمی کرد، واتا نێرباز.

٥٨- وە لە عطاء بن ابی رباحەوە ( رحمه الله ) دەفەرمووێ:

ئامادەبوم لای ابن زبير ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) حەوت پیاویان بۆ هێنا کە نێربازيان کردبوو، چواریان خێزاندار بوون، وە سیانیان خێزاندار نەبوون، ئەو چوارەیان دەرکرد لە مزگەوتی حرام ڕەجم کران بە بەرد، وە ئەمر کرا بە سیانەکەی تر کە حەدیان بۆ بکرێت، وە ابن عمر و ابن عباس ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهمَا ) لە مزگەوتەکە بوون.

- وە لە عبدالله بن معمرەوە ( رحمه الله ) دەفەرموێ:

نێرباز ڕەجم دەکرێت.

٦٠- وە لە ابراهیمی النخعیەوە ( رحمه الله ) فەرموویەتی :

ئەگەر بکرایە کەسێک دووجار ڕەجم بکرێت ئەوا نێرباز دووجار ڕەجم دەکرا.

٦١- وە لە ابراهیمی النخعیەوە ( رحمه الله ) فەرموویەتی :

ئەگەر بکرایە کەسێک دووجار ڕەجم بکرێت ئەوا نێرباز دووجار ڕەجم دەکرا.

٦٢- لە خالد الحذاءەوە ( رحمه الله )، کە پرسیاری کردووە لە الحسن: حەدی نێرباز چیە؟

فەرمووی: حەدی زیناکارە.

٦٣- لە جابری کوری زەیدەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ:

ئەو کەسەی کە کرداری قەومی لوط دەکات ڕەجم دەکرێت.

٦٤- ابن جريج ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

وتم بە عطاء ( رحمه الله ) بەڵگە دەهێنرێرەوە لەسەر پیاوێک کە رۆشتوەتە لای پیاوێکی دیکە ؟

فەرمووی : رەجم دەکرێت گەر خێزاندار بێت ، وە جەلد دەکرێت و دوردەخرێتەوە ئەگەر خێزاندار نەبێت.

٦٥- محمدی کوری الحسين ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

لەم هەوالانەیش :

أ- ئەوەی کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە حەدی نێرباز ئەگەر خێزاندار بوو ئەوا رەجمە ، وە ئەگەر خێزاندار نەبوو ئەوا جەلد دەکرێت و لە شار دوردەخرێتەوە ، ئەوەیش لەسەر حەدیثی ابن زبیر و عطاء .

ب- وە حەدیثی علی بن ابی طالب ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) ، وە جابری کوری زید ، وە الحسن ، وە ابراهیم و غەیری ئەویش : وە وتەیان : حەدی نێرباز رەجم کردنە ، جا رونیان نەکردوەتەوە خێزاندار بێت یاخود خێزاندار نەبێت ، لەسەر ئەو

ریوایەتەی کە لە ئەوانەوە ریوایەت کراوە : کە نێرباز رەجم لەسەریەتی ، جا خێزاندار بێت یاخود خێزاندار نەبێت .

وە کۆمەڵێک لە زانایان وتویانە ، باسیان دەکەین ان شاء اللە تعالی .

# باب ( ٥ )

باسی ئەوەی کە وتویەتی : نێرباز رەجم دەکرێت خێزاندار بێت یاخود خێزاندار نەبێت

٦٦- وە لە الزهريەوە ( رحمە اللە ) دەربارەی نێرباز : رەجم دەکرێت ژنی هەبێت یاخود ژنی نەبێت ، سونەتێکی پێشینەیە .

٦٧- صالحی کوری کیسان ( رحمە اللە ) دەفەرمووێ : گوێم لە ابن شهاب ( رحمە اللە ) بوو ، دەیفەرمووی : نێرباز رەجمی لەسەرە ، خێزانداربێت یاخود خێزاندار نەبێت ، سوننەتێکی پێشینەیە .

٦٨- عومەری کوری خطاب ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ :

هەرکەسێک کرداری قەومی لوط بکات بیکوژن .

٦٩- لە مجاهیدەوە ( رحمە اللە ) دەفەرمووێ :

لە ابن عباسەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) کەسێک ژنی نەبێت و نێربازی کردبێت ؟ فەرمووی : رەجم دەکرێت.

٧٠- وە لە جابری کوری زەیدەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەربارەی کەسێک کە داوێنی کردووە بە کۆمی کەسێکدا ، فەرمووی : کۆم رێز و حورمەتی گەورەترە لە داوێن ، رەجم دەکرێت ، ژنی هەبێت یاخود نا .

٧١- وە لە عطاء و ابن مسیبەوە کە فەرموویانە :

بکەر و بدەر بە زیناکار هەژمار دەکرێن ، ڕەجم دەکرێن ژنیان هەبێت یاخود نا .

٧٢- لە شعبیەوە ( رحمە اللە ) دەفەرمووێ :

دەکوژرێت ژنی هەبێت یاخود نا .

٧٣- لە یونسەوە ( رحمە اللە ) : کە پرسیاری کردووە لە ابن شهاب : وە ڕەبیعە بن ابی عبدالرحمن : دەربارەی نێرباز : وتویانە : ڕەجمی لەسەرە ژنی هەبێت یاخود نا .

٧٤- عبداللە بن نافع ( رحمە اللە ) دەفەرمووێ :

مالک بن انس ، وە ابن شهاب ، وە ربیعە ، وە ابن هرمز : ڕەجمیان دەبینی لەسەر کەسێک کە کرداری قەومی لوطی کردبێت ژنی هەبێت یاخود نا .

٧٥- سعیدی کوری مسیب ( رحمە اللە ) دەفەرمووێ :

لای ئێمە نێرباز ڕەجمی لەسەرە ، ژنی هەبێت یاخود نا ، سوننەتێکی پێشینەیە .

محمدی کوری الحسین ( رحمە اللە ) دەفەرمووێ :

٧٦- وتەی زوهری و وتەی ابن مسیب لەسەر ئەوە دادەنرێت : نێرباز ڕەجم دەکرێت ژنی هەبێت یاخود نا ، سوننەتێکی پێشینەیە .

وە لەسەر ئەوەیش دادەنرێت کە پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرموویەتی : بکەر و بدەر بکوژن ، وە نەی وت : ژنی هەبێت یاخود نا ، لەسەر روکەشی وتەکە دەکوژرێت .

وە ابو بکری صدیق ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) سوتاندنی بە ئاگر ، دوای وتووێژ لەگەڵ هاوەڵان ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) ، وە ئەوەیش کە ئاماژەی بۆ کرد علی کوری ابی

طالب ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) بوو وە نەی وت ژنی بێت یاخود نەیبێت ، علی بن ابی طالب ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) رەجمی نێربازی دەکرد وە نەی وت : ژنی هەبێت یاخود نا .

وە ابن عباس ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) فەرموویەتی : نێرباز رەجم دەکرێت ژنی هەبێت یاخود نا .

وە وتەی عومەری کوری خطاب ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) کە فەرموویەتی : هەرکەسێک کرداری قەومی لوط بکات بیکوژن .

ئەوە هەمووی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە زوهری وتی : سونەتی پێشینەیە

وە ئەمە وتەی زۆربەی فوقەهاکانی موسوڵمانانە : کە نێرباز رەجم دەکرێت ژنی هەبێت یاخود نا ؛ لەوانەیش مالک بن انس ، وە احمد بن حنبل ، وە غەیری یەکێک لە فوقەهاکانی موسوڵمانان .

محمدی کوری الحسین ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

٧٦- وتەی زوهری و وتەی ابن مسیب لەسەر ئەوە دادەنرێت : نێرباز رەجم دەکرێت ژنی هەبێت یاخود نا ، سوننەتێکی پێشینەیە .

وە لەسەر ئەوەیش دادەنرێت کە پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرموویەتی : بکەر و بدەر بکوژن ، وە نەی وت : ژنی هەبێت یاخود نا ، لەسەر روکەشی وتەکە دەکوژرێت .

وە ابو بکری صدیق ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) سوتاندنی بە ئاگر ، دوای وتووێژ لەگەڵ هاوەڵان ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) ، وە ئەوەیش کە ئاماژەی بۆ کرد علی کوری ابی طالب ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) بوو وە نەی وت ژنی بێت یاخود نەیبێت ، علی بن ابی

طالب ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) ڕەجمی نێربازی دەکرد وە نەی وت : ژنی هەبێت یاخود نا .

وە ابن عباس ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) فەرموویەتی : نێرباز ڕەجم دەکرێت ژنی هەبێت یاخود نا .

وە وتەی عومەری کوڕی خطاب ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) کە فەرموویەتی : هەرکەسێک کرداری قەومی لوط بکات بیکوژن .

ئەوە هەمووی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە زوهری وتی : سونەتی پێشینەیە

وە ئەمە وتەی زۆربەی فوقەهاکانی موسوڵمانانە : کە نێرباز ڕەجم دەکرێت ژنی هەبێت یاخود نا ؛ لەوانەیش مالک بن انس ، وە احمد بن حنبل ، وە غەیری یەکێک لە فوقەهاکانی موسوڵمانان .

٧٧- ابو محمد عبدالله بن العباس الطیالسی ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

اسحاق بن منصور الکوسج ( رحمه الله ) فەرمووی : بە ئیمامی احمدی کوڕی حنبلم ( رحمه الله ) وت :

نێرباز ژنی هەبێت یاخود نا ؟

فەرمووی : ڕەجم دەکرێت ژنی هەبێت یاخود نا .

اسحاق - واتا ابن راهویه فەرمووی : بەهەمان شێوە وادەڵێم .

اسحاق - واتا ابن راهویه فەرمووی : سوننەت لەوەدایە کە هەرکەسێک کرداری قەومی لوطی کرد ئەوا ڕەجم بکرێت ژنی هەبێت یاخود نا ، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرموویەتی : هەرکەسێک کرداری قەومی لوطی کرد

بیکوژن ، ریوایەت کراوە لە ابن عباسەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) لە پێغەمبەرەوە ( ﷺ ) بەهەمان شێوە .

پاشان ابن عباس ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) فەتوای دا لە پاش پێغەمبەر ( ﷺ ) کە هەرکەسێک کرداری قەومی لوطی کرد ئەوا رەجم بکرێت ئەگەر ژنیشی نەبێت ، وە ئەوە حوکمی ئەوەیە کە لە پێغەمبەرەوە ( ﷺ ) ریوایەت کراوە .

بەهەمان شێوە ریوایەت کراوە لە علی کوری ابی طالبەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) بەهەمان شێوەی ئەم وتەیە کە نێرباز رەجم دەکرێت ، وە باسی ئەوەی نەکرد کە ژنی هەبێت یاخود نا .

وە بەهەمان شێوە الله عزوجل لەگەڵ قەومی لوطی کرد .

وە ریوایەت کراوە لە ابو بکری صدیقەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) کە سوتاندویانیەتی بە ئاگر .

٧٨- لە عبداللّٰهی کوری وهبەوە ( رحمە الله ) دەفەرمووێ :

لە مالکەوە : کە پرسیاری کردوە لە ابن شهاب ( رحمە الله ) : لەبارەی پیاوێکەوە کە کرداری قەومی لوط دەکات ؟ فەرمووی : رەجمی لەسەرە ژنی هەبێت یاخود نا .

ابن وهب فەرمووی : مالکی کوری ئەنەس ( رحمە الله ) فەرمووی : ئەگەر چوار نەفەر شایەتی لەسەر بکەر و بدەر بدەن ئەوا رەجم دەکرێت ، رەجم ناکرێن تاکو دەرزی کل لە ناو جێگای کلەکە ببینرێت ( واتا دەبێت داوێنی پیاوەکە لە ناو داوێنی پیاوەکەی تر بێت وەکو چۆن دەرزی کلەکە لە ناو جێگای کلەکەیە ) ، ئەگەر گەشتنە باڵغ بوون .

محمدی کوری الحسین ( رحمە الله ) دەفەرمووێ :

٧٩- ئەگەر کەسێک وتی : هەرکەس چوە لای مێردمنداڵێک یان پیاوێک ئەوا نێربازە ، ئایا رەجم لەسەری واجبە ؟
من دەڵێم :
أ- ئەو نێربازەی کە واجبە رەجم بکرێت : لە پاشەوە ئەرواتە لای .

ب- ئەگەر جگە لە کۆم شتانی تر بکات ئەوا لە خراپەکارانە و پێویستە لەسەر ئیمام ( سەرکردەی موسوڵمانان ) سزایەکی بدات سزایەکی توند ، وە بیانکات بە پەند و عیبرەت ئەگەر باڵغ بوون
ج- ئەگەر کەسێک بالغ بوو ، وە ئەوی تریان بالغ نەبوو ، ئەوا لە باڵغەکە دەدرێت لێدانێکی توند ، وە هەرکەس وەک ئەم بێت ئەوا نوێژ لە پشتی ناکرێت ، وە شایەتی لێ وەرناگیرێ ، وە ئامانەتیش لەلای دانانرێت ، وە لەگەڵیشی دانانیشرێت ، وە سەلامیشی لێ ناکرێت تاکو تەوبە دەکات .
د- ئەگەر ئەوەی دیکەیان منداڵ بوو عەقلی کامل نەبوو ، ئەو حەدە لەسەری ئەنجام نادرێت ، وە پێی دەوترێت : ئەمە حەلال نیە و نەهی لێ کراوە
هـ- وە ئەگەر تازەپێگەشتوو بوو ، ئیمام ئەدەبی فێردەکات ، وە وەعدی پێ دەدات کە سزایەکی گەورەی بدات ئەگەر جارێکی تر هەمان شتی کردەوە ، وە نەهی دەکات لەوەی کە هاورێیەتی ئەو خراپەکارانە بکات کە مەیلی بۆ ئەوە هەیە کە دەستگەمە بکات لەگەڵ گەنجان .

٨٠- وە لەسەر ئیمامە کە نەهی بکات لە گەنجان کە جلی خراپەکاران لەبەر بکەن ( واتا جلێکی خراپ و نەگونجاوو تەسک ) ، وە نابێت هاورێیەتی کەسێک بکەن کە ئیشارەتی بۆ کراوە کە حەزی لە گەنجە .
وە بەهەمان شێوە پێویستە لەسەر باوکان کە نەهی لە منداڵەکانیان بکەن کە جلی خراپەکاران لەبەر بکەن و هاورێیەتیان بکەن ، وە پێویستە لەسەر پیاو کە هاورێیەتی گەنجی جوان و لوسکە نەکەن ، ترسە لەسەر دینەکەیان .

وە رونی دەکەمەوە لە کتێبی ( غض  الطرف ) ( باب من کره النظر الی الغلام الأمرد ، من کره مجالسته ) ان شاء الله

٨١- لە عبداللهی کوری عمرو ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی :
حەوت کەس لە رۆژی قیامەتدا الله سەیریان ناکات ، وە پاکیانیش ناکاتەوە ، وە دەفەرمووێ : برۆنە ناو ئاگرەوە لەگەڵ ئەوانەی کە چونەتە ژورەوە ، بکەر ، وە بدەر ، وە ئەوەی دەستی خۆی لەخۆی مارەکردوە ( واتا خوی ئہێنی ) ، وە ئەوەیش لەگەڵ ئاژەڵدا جوت دەبێت ، وە ئەوەیش لەگەڵ ئافرەتدا جوت دەبێت لە دواوە ، وە ئەوەیش کە دایک و کچ مارە دەکات ، وە ئەوەیش کە زینا دەکات لەگەڵ دراوسێکەیدا ، وە ئەوەیش کە ئازاری دراوسێکەی دەدا تاکو لەعنەتی لێ دەکرێت .

٨٢- لە ئەنەسی کوری مالکەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی :
حەوت کەس لە رۆژی قیامەتدا الله سەیریان ناکات ، وە پاکیشیان ناکاتەوە ، وە لەگەڵ خەڵکدا  کۆیان ناکاتەوە ، وە یەکەم کەسن کە دەچنە ئاگرەوە لەو کەسانەی کە دەرۆنە ناو ئاگرەوە ئیلا تەوبە بکەن ، ئیلا تەوبە بکەن ، ئیلا تەوبە بکەن ، ئەگەر تەوبەی کرد ئەوا الله تەوبەکەی لێ وەردەگرێت ، وە ئەو کەسەی کە دەستی خۆی لەخۆی مارە دەکات ( واتا خوی ئہێنی ) ، وە بکەر و بدەر ، وە ئەو کەسەی کە ئاڵودەی مەشروبە ، ئەوەی کە لە دایک و باوکی ئەدات هەتا داوای یارمەتی ئەکەن ( واتە هەتا دایک و باوکی لەدەست ئەوەی منداڵەکەیان لێیان ئەدات هاوار بکەن تا کەسێک ڕزگاریان بکات ) ، وە

ئەوەیش کە ئازاری دراوسێکەی دەدات تاکو لەعنەتی لێ دەکرێت ، وە ئەوەیشی زینا لەگەڵ دراوسێکەی دەکات .

محمدی کوری الحسین ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

لەم بابەدا ئامۆژگاری موسوڵمانانم کردوە هەرکەسێک وەری بگرێت ئەوا پێکاویەتی ، وە هەرکەس رەدی بکاتەوە ئەوا نەیپێکاوە ، وە مۆعیدمان لەلای اللّٰەیە عزوجل.

**آخر الكتاب**

**والحمدلله رب العالمين**

**وصلى الله على محد النبى وآله وسلم**

**وحسبنا الله ونعم الوكيل**

